یەکەمین ماڵپەڕی کوردی تایبەت بە پرسیار و وەڵامی شەرعی

# ئاشناکردنی موسڵمانان

# بە چارەسەری نەخۆشییەکان

## ( لە قورئان و فەرموودە ڕاستەکان )

**ئامادەکردنی**

سەروەت کامەران علی

**پێداچوونەوە**

مامۆستا ئاکۆ محمد

مامۆستا إدریس محمود

ba8.org - walamakan.com

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله، أما بعد:

گەر بڕوانینە قورئان و سوننەتی دروستی پەیامبەری خودا ﷺ دەبینین کۆمەڵێك شتی سروشتی وەکو شیفا و چارەسەر هاتوون کە کەسی موسڵمان بە کاری بهێنێت دوای پشت بەستنی تەواوی بە خوای گەورە ئەوا دەبێتە شیفا و چارەسەر بۆی لە نەخۆشی، جا بەندەش لەم چەند پەڕە کەمەدا هەموو ئەوانەی کە پێش چاوی کەوتوون لە قورئان و سوننەتی دروستدا کۆی کردونەتەوە، خوای گەورە لەبەر ناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی من و ئێوەش لە هەموو نەخۆشی و پەتا و دەردێك بپارێزێت اللهم آمین.

# چارەسەرەکان

## ١- ئاوی زەمزەم:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( خَيْرُ مَاءٍ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ مَاءُ زَمْزَمَ، فِيْهِ طَعَامٌ مِنَ الطُّعْمِ، وَشِفَاءٌ مِنَ السُّقْمِ )[(١)].

واتە: **باشترین ئاوێك لەسەر زەوی ئاوی زەمزەمە، وە لە جێگەی خواردنە، وە شیفایە بۆ نەخۆشی.**

وە لە فەرمودەیەکی تردا دایکە عائیشە دەیگێرێتەوە دەفەرموێت: ( كَانَ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ يَحْمِلُ مَاءَ زَمْزَمَ

(١) رواه الطبراني في الكبير برقم (١١١٦٧) ، وحسّنه الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) برقم (١١٦١) .

فِيْ الأداوَى والقِرَبِ، وَكَانَ يَصُبُّ عَلَى المَرْضَى وَيَسْقِيْهِمْ )[1] .

واتـە: **پەیامبەری خودا ﷺ ئاوی زەمزەمی هەڵدەگرت لە دەفر و قاپ و جەوەنە، وە دەیکرد بەسەر نەخۆشدا و پێی دەدان بۆ خواردنەوە.**

وە پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ )[2] . واتـە: **ئاوی زەمزەم بۆ ئەو نییەتەیە بۆی خوراوە.**

---

(٢) رواه البخاري في تاريخ الكبير برقم (٦٣٩) ، وصحّحه الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) برقم (٨٨٣) .

(١) رواه ابن ماجه برقم (٣٠٦٢) ، وصحّحه الألباني في (صحيح ابن ماجه) برقم (٢٥٠٢) .

(٢) زاد المعاد (٤/٣٩٣) .

ئیمامی ( ابن القيّم ) دەفەرمویت: **( جَرَّبْتُ أَنَا وَغَيْرِي مِنَ الاسْتِشْفَاءِ بِمَاءِ زَمْزَمَ أُمُوراً عَجِيْبَةً، وَاسْتَشْفَيْتُ بِهِ مِنْ عِدَّةِ أَمْرَاضٍ، فَبَرَأْتُ بِإِذْنِ اللهِ )**[١].

واتە: **خۆم و جگە لە خۆم ئاوی زەمزەمان تاقیکردۆتەوە بۆ وەرگرتنی شیفا کۆمەڵێ شتێکی سەیرمان بینیوە، وە وەکو شیفا بەکارم هێناوە بۆ زۆرێك لە نەخۆشییەکان، چاك بومەتەوە بە ئیزنی خودا** وە ئیمامی( ابن العربي ) دەربارەی شیفا بە ئاوی زەمزەم دەفەرمویت: **( هَذَا مَوْجُودٌ فِيْهِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، لِمَنْ صَحَّتْ نِيَّتُهُ، وَسَلِمَتْ طَوِيَّتُهُ، وَلَمْ يَكُنْ بِهِ مُكَذِّباً، وَلاَ شَرِبَهُ**

**مُجَرِّبَاً، فَإِنَّ اللهَ مَعَ المتَوَكِّلِينْ، وَهُوَ يَفْضَحُ المجَرِّبِينْ )**[1] .

واتـە: **ئەم شیفایەی تێدا دەبێت تا ڕۆژی قیامەت، بۆ كەسێك نییەتی چاك بكات و دەروونی پاك بێت، وە بە درۆی نەزانێت، وە بەنییەتی تاقیكردنەوەی نەیخواتەوە، بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ ئەوانەیە كە پشتی پێ دەبەستن، وە ئەو كەسانەش ڕیسوا دەكات كە بۆ تاقیكردنەوەی دەیخۆنەوە.**

❊ وە ئەم ئاوە لە نێو عەرەبدا پێی دەوترا **( عافية )**.

واتـە: شیفا و لەش ساغی

***

(١) أحكام القرآن لابن العربي (٣/٩٨)

## ٢- كەڵەشاخ:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( **الشِّفَاءُ فِيْ ثَـلَاثَةٍ ... وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ** )[١].

واتـە: **شیفا لە سێ شت دایە ... - یەكێك لەوانە — كەڵەشاخ.**

وە پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت لە فەرمودەیەكی تردا: ( **إِنَّ أَفْضَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الحِجَامَةُ أَوْ هُوَ مِنْ أَمْثَلِ دَوَائِكُمْ** )[٢].

واتـە: **بەڕاستی باشترین ئەو شتانەی چارەسەری پێ بكەن كەڵەشاخە یان لە چاكترین چارەسەرەكانتانە.**

---

(١) رواه البخاري برقم (٥٢٦٩) .

(٢) رواه البخاري برقم (٥٢٦٣) ، ومسلم برقم (٢٩٥٢) .

لــە ڕیــوایــەتێکی تــردا هاتــووە پەیامبەری خــودا ﷺ دەفــەرمــوێت: ( إِنْ كَانَ فِيْ شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ فَفِيْ شَرْطَةِ مِحْجَمٍ )[١].

واتـە: **ئەگەر لە شتێك لە چارەسەرەکانتاندا چارەسەر هەبێت ئەوا لە کەڵەشاخدا هەیە.**

وە لە بارەی گــەورەیی کــەڵــەشــاخــەوە ( ابن مسعــود ) دەفــەرموێت: ( حَدَّثَ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ: أَنَّهُ لَمْ يمُرْ عَلَى مَلإٍ مِنَ الملائِكَةِ إِلَّا أَمَرُوهُ أَن مُرْ أُمَّتَكَ بِالحِجَامَةِ )[٢].

---

(٣) رواه البخاري برقم (٦٥٨٣) ، ومسلم برقم (٢٢٠٥) .

(١) رواه الترمذي برقم ( ٢٠٥٢) ، وصحّحه الألباني برقم (٣٤٦٢)

.

واتە: **پەیامبەری خودا ﷺ باسی ئەو شەوەی كرد كە شەو ڕەوی پێكرا: بەلای هیچ كۆمەڵە فریشتەیەك لە فریشتەكاندا تێنەپەڕی بوو ئیللا فەرمانیان پێ كردبوو كە فەرمان بە ئومەتەكەت بكە بە كەڵەشاخكردن**

تێبینییەكی پێویست: ئەو ڕۆژانەی سوننەتە كەڵەشاخی تێدا بكرێت بریتییە لە ( ١٧ ، ١٩ ، ٢١ ) ی مانگی كۆچی، وە دروستیشە لە جگە لەم سێ ڕۆژەش بكرێت.

***

## ٣- هەنگوین:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[1].

واتـە: **لە ناو سكی ئەو هەنگانە خواردنەوەیەك بۆ ئێوە هەیە كە هەنگوینە ، وە ڕەنگی جیاوازە كە شیفای تێدایە بۆ خەڵكی، وە بە دڵنیایی ئەمانە هەمووی بەڵگە ونیشانەن لەسەر توانا و دەسەلاّت و تاك و تەنهایی خوای گەورە بۆ كەسانێك كە بیر بكەنەوە.**

وە پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرمویت: **( الشِّفَاءُ فِيْ ثَلَاثَةٍ ... شَرْبَةِ عَسَلٍ )**[1]. واتـە: **شیفا لە سیٚ شت دایە ...**

---

(١) سورة النحل ، الآية (٦٨) .

**- یەکێك لەوانە – خواردنەوەی هەنگوین.**

وە لە فەرمودەیەکی تردا لە ( أبو سعيد الخدري )ەوە دەفەرمویت: **( جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَخِي اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، فَسَقَاهُ ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: إِنِّي سَقَيْتُهُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلَّا اسْتِطْلَاقاً ، فَقَالَ لَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ جَاءَ فِي الرَّابِعَةِ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، فَقَالَ: إِنِّي سَقَيْتُهُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلَّا اسْتِطْلَاقاً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: صَدَقَ اللهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيْكَ، فَسَقَاهُ فَبَرَأَ )**[٢].

واتە: **پیاوێك هاتە خزمەتی پەیامبەری خودا ﷺ فەرموی: براکەم تووشی سکچوون بووە، پەیامبەری خودا**

---

(٢) رواه البخاري برقم (٥٢٦٩) .

(١) رواه البخاري برقم (٥٦٨٤) ، ومسلم برقم (٢٢١٧) .

**ﷺ فەرموی: هەنگوینی پێ بدە ، ئەویش پێی دا و دواتر هاتەوە و وتی: من هەنگوینم پێدا کەچی سکچوونەکەی زیادی کرد، پەیامبەری خودا ﷺ سێ جار پێی وت هەنگوینی پێ بدە، لە جاری چوارەم هاتەوە و وتی: من هەنگوینم پێدا کەچی سکچوونەکەی زیادی کرد، پەیامبەری خودا ﷺ فەرموی: خوا ڕاستی فەرموو وە سکی براکەت درۆی کرد، ئەوە بوو جارێکی تر پێی دایەوە چاك بویەوە.**

***

## ٤- ڕەشـکـە:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: ( إِنَّ هَذِهِ الحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا مِنَ السَّامِ، قُلْتُ: وَمَا السَّامُ ؟ قَالَ: الموْتُ )[(١)].

واتـە: **ئەم ڕەشکەیە شیفایە بۆ هەموو دەردێك جگە لە (السَّام ) نەبێت، - گێڕەوەی فەرمودەکە دەڵێت وتم (السَّام ) چییە؟ فەرموی: مردن.**

***

(١) رواه البخاري برقم (٥٦٨٧) ، ومسلم برقم (٢٢١٥) .

## ٥- ئاوی دۆمەڵان:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرمویت: ( الكَمْأَةُ مِنَ المَنِّ الَّذِيْ أَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى بَنِيْ إِسْرَائِيْلَ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ )[١].

**واتـە: دۆمەڵان جۆرێکە لەو گەزۆیەی کە خوای گەورە بۆ بەنی ئیسرائیلی دابەزاند، وە ئاوەکەشی شیفایە بۆ چاو.**

***

(٢) رواه البخاري برقم (٥٧٠٨) ، ومسلم برقم (٢٠٤٩) .

## ٦- زەیـتـون:

خوای گەورە كاتێك باسی زەیتون دەكات لە قورئاندا بە دارێكی پیرۆز و موبارەك ناوی دێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيۡتُونَةٍ ﴾[1].

وە هەروەها لەبەر گەورەیەكەی سوێندی پێ دەخوات ،خوای گەورە دەفەرمـوێت: ﴿ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴾[2]. وە پەیامبەری خودا ﷺ دەفـەرمـوێت: **( كُـلُـوا الـزَّيْـتَ وَادَّهِنُوا بِـهِ، فَـإِنَّـهُ مِنْ شَجَـرَةٍ مُـبَـارَكَـةٍ )**[3].

---

(١) سورة النور ، الآية (٣٥) .

(٢) سورة التين ، الآية (١) .

(٣) رواه الترمذي برقم (١٨٥١) ، وحسّنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم (٣٧٩).

واتـە: **زەیت بخۆن و خۆتانی پێ چەور بکەن، چونکە بەڕاستی لە دارێکی پیرۆزە.**

## ٧- شیری مانگا:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: **( عَلَيْكُمْ بِأَلْبَانِ البَقَرِ فَإِنَّهَا تَرُمُّ مِنْ كُلِّ الشَجَرِ، وَهُوَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ )**[1].

واتـە: **پەیوەست بن بە شیری مانگاوە چونکە لە هەموو درەختێك دەخوات، وە شیفایە بۆ هەموو دەردێك.**

وە لە فەرمودەیەکی تردا پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: **( إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَنْزِلْ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ**

(١) رواه الطبراني برقم (٩١٦٤) ، والحاكم برقم (٨٢٢٤) ، وصحّحه الألباني في ( صحيح الجامع ) برقم (٤٠٥٩) .

**شِفَاءً إِلّاَ الهَرَمَ، فَعَلَيْكُمْ بِأَلْبَانِ البَقَرِ فَإِنَّهَا تَرُمُّ مِنْ كُلِّ الشَّجَرِ )**[1].

واتـه: **بەڕاستی خوای گەورە هیچ دەردێكی دانەبەزاندووە ئیللا چارەسەریشی بۆ دابەزاندووە جگە لە پیری، بۆیە پەیوەست بن بە شیری مانگاوە چونكە لە هەموو درەختێك دەخوات.**

***

(٢) رواه النسائي في السنن الكبرى برقم (٦٨٦٣) ، وابن حبان برقم (٦٠٧٥) ، والحاكم برقم (٧٤٢٥) واللفظ له ، وصحّحه الألباني في سلسلة الصحيحة برقم (٥١٨).

## ٨- عودی هیندی ( قیستی هیندی ):

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: **( عَلَيْكُمْ بِهَذَا العُوْدِ الهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيْهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةَ: يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ العُذْرَةِ، وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الجَنْبِ )**(١) .

واتە: **دەست بگرن بە دارە هیندیەوە بەڕاستی حەوت جۆر شیفای تێدایە : لە کاتی ئازاری قوڕگدا لە لوتەوە بە**

---

(١) رواه البخاري برقم (٥٦٩٢) ، ومسلم برقم (٢٢١٤) .

**شێوەی دڵۆپ دڵۆپ دەکرێتە ناو لوتەوە، وە بۆ ئازاری لا تەنیشتەکانیش لە دەمەوە بەکاردەهێنرێت**(١).

لە سودەکانی **داری هیندی** ئیمامی ( ابن حجر ) دەڵێت:

**( وَقَدْ ذَكَرَ الأَطِبَّاءُ مِنْ مَنَافِعِ القِسْطِ: أَنه يَدُرُّ الطّمثَ وَالبَولَ، وَيَقْتُلُ دِيْدَانَ الأَمْعَاءِ، وَيَدْفَعُ السُّمَّ وَحُمَّى**

---

**(٢)** ئیمامی ( ابن حجر ) لە ڕاڤەی فەرمودەکە دەڵێت: ( كَذَا وَقَعَ الاقْتِصَارُ فِيْ الحَدِيْثِ مِنَ السَّبْعَةِ إِلَى اثْنَيْنِ ، فَإِمَّا أَنْ يَكُوْنَ ذَكَرَ السَّبْعَةَ فَاخْتَصَرَهُ الرَّاوِي أَو اقْتَصَرَ عَلَى اثْنَيْنِ لِوْجُوْدِهِمَا حِيْنَئِذٍ دُوْنَ غَيْرِهِمَا ) فتح الباري (١٠/١٤٩).

**واتـە:** لەم فەرمودەیە لە جیاتی حەوت جۆرە شیفایەکە دووانی باس کراوە ، ئەمەش یان ئەوەیە پەیامبەری خودا ﷺ باسی حەوت جۆرەکەی کردووە بەڵام ڕاویەکە دووانی باس کردووە یان لەبەر ئەوەی ئەم دوو جۆرە باس کراوە چونکە لەو سەردەمە ئەم دوو جۆرە نەخۆشییە هەبووە و دەرد و نەخۆشییەکانی تر نەبووە .

الرِّبْعِ وَالوَرِدِ، وَيُسَخِّنُ المعِدَةَ، وَيُحَرِّكُ شَهْوَةَ الجِمَاعِ، وَيُذْهِبُ الكَلَفَ طلاءً )[1].

واتـە: **پزیشكەكان هەندێك لە سودەكانی داری هیندیان باس كردووە، لەوانە: هاتنە خوارەوەی خوێنی سوڕی مانگانە و میز ئاسان دەكات، وە كرمەكانی مەعیدە دەكوژێت، ژەهر و جۆرەكانی تا ناهێڵێت، مەعیدە گەرم دەكات، ئارەزوو بۆ جیماع دەجوڵێنێت، بەڵەكی ڕومەت ناهێڵێت.**

وە هەندێكی تر سودی تریان باس كردووە لەوانە: ئازاری گورچیلەكان و هەلاّمات ناهێڵێت، وە هەندێكی تر دەڵێن تەنانەت سودی بۆ لەوزەتێنیش هەیە.

---

(١) فتح الباري (١٠/١٤٩) .

جا ئەم جۆرە دەرمانە لە هند و بەتايبەت لە كشمير و لە (صين ) يش هەيە، توێكڵ و ڕەگەكەی بەكاردێت، وە بازرگانە عەرەبەكانی پێشوو لە ڕێگای دەريا دەيان هێنا بۆيە ناوی نراوە **( القسط البحري )** هەر وەك چۆن پێشی دەوترێت **( القسط الهندي )**، وە ڕەنگە سپيەكەی پێی دەگوترێت **( القسط البحري )** وە ڕەنگە ڕەشەكەشی پێی دەگـوتـرێت **( القسط الهندي )** وە هەروەها لە فەرمودەكاندا بە **( العود الهندي )** هاتووە.

## چۆنیەتی دەستكەوتنی و بەكارهێنانی:

ئەم دارە لە بازاڕ و لە دوكانی بەهارات فرۆشەكان دەست دەكەوێت كە بە هاڕاوی هەيە، يەك كەوچكی چا تێكەڵ بە پەرداخێك ئاو دەكەيت و دەيخۆيتەوە.

***

## ٩- خورما:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَومٍ سَبْعَ تمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرُّهُ فِيْ ذَلِكَ اليَوْمِ سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ )[١] .

(١) رواه البخاري برقم (٥٤٤٥)، ومسلم برقم (٢٠٤٧).

واتە: **هەرکەس بەیانی بە حەوت خورمای عەجوە بکاتەوە لەو ڕۆژەدا ژەهر و سیحر زیانی پێ ناگەیەنن.**

وە لە فەرمودەیەکی تردا پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( فِيْ عَجْوَةِ العَالِيَةِ شِفَاءٌ أَو إِنَّهَا تِرْيَاقٌ أَوَّلَ البُكْرَةِ )[1]. واتە: **خورمای عەجوەی سەرەوەی شاری مەدینە شیفایە، یان دژە ژەهرە لە سەرەتای ڕۆژدا.**

وە پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( وَالعَجْوَةُ مِنَ الجَنَّةِ وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ )[2].

---

(٢) رواه مسلم برقم (٢٠٤٨).

(١) رواه الترمذي برقم (٢٠٦٨) ، وابن ماجه برقم (٣٤٥٣) ، وصحّحه الألباني في ( صحيح ابن ماحه ) برقم ( ٢٧٨٣ ) .

واتـه: **خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیە وە شیفایە لە ژەهر.**

زانایانمان ڕاجیاوازن دەربارەی ئەوەی ئایا تەنها خورمای عەجوەی سەرەوەی شاری مەدینە مەبەستە یان هەموو خورمایەك دەگرێتەوە وە باسكردنی عەجوەش وەكو نمونەیە؟ ، كۆمەڵێك لە زانایان بۆ ئەوە ڕۆشتوون ئەم پاراستنەی لە فەرمودەكەدا باسكراوە تایبەتە بە خورمای عەجوەی سەرەوەی شاری مەدینە، وە كۆمەڵێكی تر بۆ ئەوە ڕۆشتوون ئەم پاراستنەی لە فەرمودەكەدا باسكراوە بە هەموو جۆرەكانی خورما بەدی دێت.

قَالَ الشَّيْخُ ابْنُ بَاز رَحِمَهُ الله: ( **وَيُرْجَى أَنْ يَنْفَعَ بِذَلِكَ التَّمْرَ كُلَّهُ، لَكِنْ نَصَّ عَلَى المدِيْنَةِ لِفَضْلِ تَمْرِهَا وَالخُصُوْصِيَّةِ فِيْهِ، وَيُرْجَى أَنَّ اللهَ يَنْفَعُ بِبَقِيَّةِ**

التَّمْرِ إِذَا تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تمَرَاتٍ، وَقَدْ يَكُونُن ذَكَرَ ذَلِكَ لِفَضْلٍ خَاصٍ وَمَعْلَمٍ خَاصٍ لِتَمْرِ المدِيْنَةِ لاَ يمْنَعُ مِنْ وُجُودِ تِلْكَ الفَائِدَةِ مِنْ أَنْوَاعِ التَّمْرِ الأُخْرَى الَّتِيْ أَشَارَ إِلَيْهَا عَلَيْهِ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ، وَأَظُنُّهُ جَاءَ فِيْ بَعْضِ الرِّوَايَاتِ مِنْ تَمْرٍ مِنْ غَيْرِ قَيْدٍ )[1].

واتە: ئومێد دەكرێت خوای گەورە بە هەموو خورماكانی تر ئەو سوودە بگەیەنێت بەڵاٌم باسی مەدینە هاتووە لەبەر گەورەیی خورماكەی و تایبەتكردنی، وە ئومێد دەكرێت خوای گەورە بەهەموو خورماكانی تر ئەو سوودە بگەیەنێت ئەگەر كەسێك بەیانی بكاتەوە بە حەوت خورما، وە دەكرێت پەیامبەری خوا ﷺ خورمای عەجوەی باس

(١) مجموع فتاوی ابن باز (٨/١٠٩) .

**كردبێت له‌به‌ر فه‌زڵی و دیاریكردنی، ئه‌مه‌ ڕێگر نییه‌ له‌وه‌ی خورماكانی تریش ئه‌م سوده‌یان تێدا بێت كه‌ په‌یامبه‌ری خوا ﷺ ئاماژه‌ی پێكردووه‌، وه‌ گومان ده‌به‌م له‌ هه‌ندێك له‌ ڕیوایه‌ته‌كانی تر هاتووه‌ به‌ خورما به‌بێ دیاریكردنی جۆره‌كه‌ی.**

قَالَ الشَّيْخُ ابْنُ عُثَيْمِينْ رَحِمَهُ اللهُ: **( كَانَ شَيْخُنَا ابْنُ سِعْدِي رَحِمَهُ اللهُ يَرَى أَنَّ ذَلِكَ عَلَى سَبِيلِ التَّمْثِيلِ، وَأَنَّ المقْصُوْدَ التَّمْرُ مُطْلَقاً )**[1]. واتـه: **مامۆستامان** (عبدالرحمن بن ناصر السعدي ) **ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێت وای ده‌بینی باسكردنی خورمای عه‌جوه‌ له‌ فه‌رموده‌كه‌ نمونه‌یه‌كه‌ له‌ جۆری خورما، وه‌ مه‌به‌ست هه‌موو خورمایه‌كه‌.**

---

(١) الشرح الممتع (٥/١٢٣) .

بە گشتی لە ئیسلامدا خورما تایبەت کراوە، هەروەکو پەیامبەری خودا ﷺ بە دایکە عائیشەی فەرموو: **( يَا عَائِشَةَ بَيْتٌ لاَ تمْرَ فِيْهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ، قالها مرَّتينِ أَوْ ثَلاَثاً )**[1]. واتە: **ئەی عائیشە ماڵێك خورمای تێدا نەبێت خەڵکی ئەو ماڵە برسین، دووجار یان سێ جار ئەمەی فەرموو.**

## ١٠- ئاردەوا:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: **( التَّلْبِيْنَةُ مُجِمَّةٌ لِفُؤَادِ المرِيْضِ، تُذْهِبُ بِبَعْضِ الحُزْنِ )**[2].

---

(٢) رواه مسلم برقم (٢٠٤٦) .

(١) رواه البخاري برقم ( ٥٤١٧) ، ومسلم برقم ( ٢٢١٦) .

واتـە: **ئاردەوا ئارامکەرەوەیە بۆ دڵی نەخۆش هەندێك خەفەت لادەبات.**

ئەم شێوازە خواردنە بەپێی شوێن و خەڵکەکان ناوەکەی دەگۆڕێت بۆیە ئەم ناوانەی پێ دەوترێت ( ئاردەوا ، حەلوا ) وە ناوی تریش، وە زۆر جار لای خۆمان ئافرەت منداڵی بێت بۆی دروست ئەکرێت، بەلاَم تایبەت نییە بە کاتی منداڵبونەوە بەڵکو لە هەر کاتێك ویستت لێ بوو دەتوانیت دروستی بکەیت و بیخۆیت، لە دایکە عائشەوە هاتووە لە کاتی وەفاتی کەسێکدا فەرمانی بە خزمە نزیکەکانی مردووەکە کردووە ئەم خواردنە دروست بکەن و بیخۆن[١].

## شێوازی دروستکردنی ئەم خواردنە:

شێوازی یەکەم: ئاردەکە بە وشکی دەخەیتە سەر ئاگر لەناو شتێکدا کە رۆنی تێدا بێت تاوەکو ڕەنگەکەی قاوەیی

---

(٢) رواه البخاري برقم ( ٥٤١٧) ، ومسلم برقم (٢٢١٦) .

دەبێتەوە دواتر ئاو شەکری تێدەکرێت و تێکەڵ دەکرێت تا بە تەواوی خەس ئەبێتەوە ئەوکات دەخورێت.

شێوازی دووەم: ئارد و ئاو شەکرەکە تێکەڵ دەکرێت و تێکەڵ دەکرێت لەناو شتێکدا کە ڕۆنی تێدا بێت لەسەر ئاگر تاوەکو خەس ئەبێتەوە پاشان دەخورێت.

وە دەکرێت هەنگوینیشی تێبکرێت هەندێك جار.

## ١١- کل ( چاو ڕەشتن ):

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( اكْتَحِلُواْ بِالإِثْمِدِ فَإِنَّهُ يَجْلُواْ الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ )[1].

(١) رواه الترمذي برقم (١٧٥٧) ، وصحّحه الألباني في ( صحيح الترغيب والترهيب ) برقم (٢١٠٤) .

واتـە: **چاوتان بڕەشن بە ( الإِثمد ) لەبەرئەوەی بینین ڕونتر دەكاتەوە و موی برژانگ دەچێنێت و گەشەی پێ دەدات.**

( الإثمد ): جۆرێكە لە باشترین جۆرەكانی كل لە حیجاز و مەغریب و أصبهان و ئەو شوێنانە هەیە، لە بنچینەدا لە بەردێكی ڕەشی سوراویەوە دەردەهێنرێت.

وە لە فەرمودەیەكی تردا پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: **( إِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الإِثْمِدُ يَجْلُواْ البَصَرَ وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ )**[١].

واتـە: بەڕاستی لە باشترین كلەكانتان (الإثمد)ە.

---

(٢) رواه أبو داود برقم (٣٨٧٨) ، والنسائي برقم (٥١١٣) ، وابن ماجه برقم (٣٤٩٧) ، وصحْحه الألباني في ( صحيح ابن ماجه ) برقم (٢٨١٩) .

لەبەرئەوەی بینین ڕونتر دەكاتەوە و موی برژانگ دەچێنێت و گەشەی پێ دەدات.

وە لە فەرمودەیەكی تردا پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: **( عَلَيْكُمْ بِالإِثْمِدِ فَإِنَّهُ مَنْبَتَةٌ لِلشَّعْرِ، مَذْهَبَةٌ لِلقَذَى، مَصْفَاةٌ لِلبَصَرِ )**[(١)].

واتە: **دەست بگرن بە كلەوە لە جۆری** ( الإثمد ) **لەبەرئەوەی موی برژانگ دەچێنێت و گەشەی پێ دەدات، لادەری پیسی چاوە، پاككەرەوەیە بۆ چاو بینین ڕۆشن دەكاتەوە .**

---

(١) رواه الطبراني في الكبير برقم (١٨٣) ، وحسّنه المنذري والعراقي وابن حجر ، وحسّنه الألباني في ( سلسلة الأحاديث الصحيحة ) برقم (٦٦٥) .

كل ئەگەر وەكو چارەسەر بەكار بێت بێ جیاوازی زانایان دروستە و سوننەتە بۆ پیاوان و ئافرەتان، خۆ ئەگەر وەكو جوانی بەكار هات ئەوا بۆ ئافرەتان بێ ڕاجیاوازی زانایان دروستە بەڵام بۆ پیاوان جێگەی ڕاجیاوازی زانایانە.

قَـالَ الشَّيْخُ مُحَـمَّـدُ بنُ صَـالِـحِ العُـثَـيْـمِـيْـن:

(**وَالاكْتِحَالُ نَوْعَانِ: أَحَدُهُمَا**: اكْتِحَالٌ لِتَقْوِيَةِ البَصَرِ، وَجَلاَءُ الغِشَاوَةِ مِنَ العَيْنِ، وَتَنْظِيْفُهَا وَتَطْهِيْرُهَا بِدُون أَنْ يَكُوْنَ لَهُ جَمَالٌ، فَهَذَا لاَ بَأْسَ بِهِ ، بَلْ إِنَّهُ مِمَّا يَنْبَغِي فِعْلُهُ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَكْتَحِلُ فِيْ عَيْنَيْهِ وَلاَ سِيَّمَا إِذا كَانَ بِالإِثْمِدِ.

**الثَّانِيْ**: مَا يَقْصِدُ بِهِ الجَمَالُ والزِّيْنَةُ فَهَذَا لِلنِّسَاءِ مَطْلُوْبٌ، لِأَنَّ المرْأَةَ مَطْلُوبٌ مِنْهَا أَن تتَجَمَّلَ لِزَوْجِهَا، أَمَّا الرِّجَالُ فَمَحَلُّ نَظَرٍ، وَأَنا أَتَوَقَّفُ فِيْهِ، وَقَدْ

يُفَرَّقُ فِيْهِ بَيْنَ الشَّابِّ الَّذِيْ يُخْشَى مِنْ اكْتِحَالِهِ فِتْنَةٌ فَيُمْنَعُ وَبَيْنَ الكَبِيْرِ الَّذِيْ لاَ يُخْشَى ذَلِكَ مِنَ اكْتِحَالِهِ فَلاَ يُمْنَعُ )[1].

واتـه: چاو ڕەشتن دوو جۆرە، یەكەمیان: چاو ڕەشتنێكە بۆ بەهێز كردنی بینین و لادانی بەربەستێك لە پێش چاو و پاك كردنەوەی بەبێ ئەوەی جوانی هەبێت، ئەمە كێشەی تێدا نییە بەڵكو باشتر وایە بكرێت, چونكە پەیامبەری خودا ﷺ هەردوو چاوی دەڕشت بەتایبەتی ئەگەر بە جۆری (الإثمد ) بێت.

دووەم: مەبەست پێی جوانی بێت، ئەمە بۆ ئافرەتان داواكراوە، چونكە ئافرەت داوای لێ كراوە بۆ پیاوەكەی خۆی جوان بكاتەوە، بەڵام بۆ پیاوان، جێگەی تێڕوانینە، وە

---

(١) مجموع الفتاوى للشيخ العثيمين (١١/٧٣) .

من تێيدا دەوەستم، وە دەكرێت جياكارى بكرێت لە نێوان گەنجێك كە چاو ڕەشتنەكەى دەبێتە فيتنە ئەوا ڕێگرى لىَ دەكرێت، وە كەسێكى گەورە كە چاو ڕەشتنەكەى نابێتە فيتنە ئەوا ڕێگرى لىَ ناكرێت.

***

## ١٢- خەنەكردن:

لـە ( سَلْمَـى ) وە خزمەتكارى پەيامبەرى خـودا ﷺ دەفەرمـوێـت: ( مَا كَانَ أَحَدٌ يَشْتَكِي إِلَى رَسُوْلِ اللهِ

وَجَعَاً فِيْ رَأْسِهِ إِلَّا قَالَ: احْتَجِمْ، وَلاَ وَجَعَاً فِيْ رِجْلَيْهِ إِلاَّ قَالَ: اخْضِبْهُمَا )[1].

واتـە: **هیچ كەس نەبووە ناڕەحەتی بردبێتە لای پەیامبەری خودا ﷺ لە ئازارێك لە سەریدا ئەوا پێی وتووە: كەڵەشاخ بكە، وە لە ئازارێك لە قاچیدا ئەوا پێی وتووە: هەردوو قاچت بگرە لە خەنە.**

وە هەروەها هەر لە ( سَلْمَـى ) وە دەڵێت: ( مَـا يَكُـونُ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ قُرْحَـةٌ وَلاَ نَكْبَةٌ إِلاَّ أَمَـرَنِيْ رَسُوْلُ اللهِ ن أَنْ أَضَعَ عَـلَـيْـهَـا الحِـنَّـاءَ )[2].

---

(١) رواه أبو داود برقم (٣٨٥٨) ، وحسّنه الألباني في ( صحيح أبي داود ) بالرقم المذكور .

(٢) رواه الترمذي برقم (٢٠٥٤) ، وصحّحه الألباني في ( صحيح الترمذي ) بالرقم المذكور .

واتـە: **هەركات پەیامبەری خودا ﷺ برینێكی قورس یان سوكی تووش بووایە ئەوا فەرمانی پێ ئەكردم شوێنی برینەكە بگرم لە خەنە.**

كەواتە لە میانی ئەم دوو فەرموودەیەوە بۆمان دەردەكەوێت پەیامبەری خودا ﷺ خەنەی وەكو چارەسەر بەكارهێناوە.

تێبینییەكی گرنگ: دەست و قاچ لە خەنە گرتن تایبەتمەندی ئافرەتانە نەك پیاوان، بۆیە دروست نییە بۆ پیاوێك دەست و قاچی لە خەنە بگرێت وە خۆ شوبهاندنە بە ئافرەتان كە لەعنەتی لەبارەوە هاتووە، تەنها پرچ و قژی نەبێت كە دروستە لە خەنەی بگرێت بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی كە

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: ( إِنَّ أَحْسَنَ مَا غُيِّرَ بِهِ الشَّيْبُ الحِنَّاءُ والكَتْمُ )[١].

واتە: باشترین شتێك كە قژ و پرچی سپی پیاوانی پێ بگۆڕدرێت خەنە و وسمەیە[٢]، بەلاّم خۆ ئەگەر پیاوێك وەكو چارەسەر بەكاری هێنا بۆ قاچی یاخود دەستی ئەوا دروستە بەبەڵگەی فەرموودەكەی ( سَلْمَـى ) كە باسكرا.

## ١٣- شیری وشتر:

(١) رواه الترمذي برقم (١٧٥٣) ، وصحّحه الألباني في ( صحيح الترمذي ) بالرقم المزكور .

(١) جۆرێكە لە ڕووەك لە یەمەن هەیە كاتێك سەر و ڕیشی پێ ڕەنگ دەكرێت ڕەنگێكی ڕەش بەرەو سور دەردەچێت ، بەلاّم ڕەنگی خەنە سوور دەردەچێت ، خۆ ئەگەر خەنە و وسمە تێكەڵ كرا ڕەنگێك دەردەچێت لە نێوان ڕەش و سوور.

( أنس )ی كوڕی ( مالك ) خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: **( قَدِمَ أُنَاسٌ مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ، فَاجْتَوَوا المدِيْنَةَ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ بِلِقَاحٍ وَأَن يَشْرَبُواْ مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا .. الحديث)**[1].

واتـە: **خەڵكانێك لە هۆزی** ( عوكل ) **یان** ( عورەینە ) **هاتن بۆ مەدینە، كەش و هەوای مەدینەیان پێ نەكەوت و نەخۆش كەوتن پەیامبەری خودا ﷺ فەرمانی پێ كردن بڕۆن بۆ لای وشترە شیردەرەكان و لە شیر و میزی بخۆنەوە.**

## چەند ڕونكردنەوەیەكی پێویست لەسەر میزی وشتر:

١- ئەمە فەرموودەی پەیامبەری خودایە ﷺ و گومان لە ڕاستییەتی فـەرمـوودەكـە نییە، چونكـە لـە هەردوو پەرتـووكی ( الـبـخــاري ) و ( الـمـسـلـم ) دا هاتووە كە

---

(٢) رواه البخاري برقم (٢٣٣) ، ومسلم برقم (١٦٧١) .

دوو ڕاستترين كتێبن لە دواى قورئانى پيرۆز وە ئوممەتى ئيسلام كۆدەنگن لەسەر ڕاستى و دروستى ئەو دوو كتێبە .

**٢-** بنچينە لە ميزى مرۆڤ و ئاژەڵدا پيسييە جگە لە ميزى ئەو ئاژەڵانەى گۆشتيان دەخورێت، بەڵام بۆ خواردنەوە تەنها ميزى وشتر دروستە بوخرێتەوە ئەويش بۆ چارەسەر.

**٣-** خواردنى ميزى وشتر لە كاتى پێويستى ( الضرورة ) دەخورێتەوە بۆ نەخۆشييەك كە توشت بووە، نەك هەركات ويستت لێبێت بيخۆيتەوە و بڵێى شيفايە نەخێر نابێت وەكو زانايانمان دەڵێن.

**٤-** وە لە ڕووە تەندروستى و بزيشكيەكەشەوە سەلمێندراوە كە ميزى وشتر چارەسەرى تێدايە.

## ١٤- دوگى مەڕى عەرەبى:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( شِفَاءُ عِرقِ النَّسَا، أَلْيَةُ شَاةٍ أَعْرَابِيَّةٍ - وفي رواية – ( أَلْيَةُ كَبْشٍ عَرَبِيٍّ أَسْوَدَ لَيسَ بِالعَظِيْمِ وَلاَ بالصَّغِيرِ )[١]، تُذَابُ، ثُمَّ تُجَزَّأُ ثَلاثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ يُشْرَبُ عَلَى الرِّيقِ فِيْ كُلِّ يَوْمٍ جُزْءٌ)[٢]. واتە: **چارەسەری نەخۆشی** عِرق النَّسا ( **ئەم نەخۆشییە بریتییە لە ئازارێکی توند لە خوارەوەی بڕبڕەی پشت تا ماسولکەی دانیشتن (سمت) تا** دواوەی **ڕان و خوارەوەی ئێسقانی پێ درێژ دەبێتەوە ) چارەسەرەکەی (دوگی ) مەڕێکی عەرەبی ڕەش کە نە زۆر گەورە بێت نە**

---

**(١)** رواه أحمد برقم (١٣٢٩٥) ، وقال محققو المسند : إسناده صحيح على شرط الشيخين .

**(٢)** رواه ابن ماجه برقم (٣٤٦٣) ، وصحّحه الألباني في ( صحيح ابن ماجه ) بالرقم المذكور .

**زۆر بچوك ده‌توێنرێته‌وه‌، پاشان ده‌كرێته‌ سێ به‌شه‌وه‌ و له‌ سه‌ره‌تای ڕۆژ به‌ سكی به‌تاڵ ده‌خورێته‌وه‌ هه‌ر ڕۆژه‌ و به‌شێك.**

## ڕونكردنه‌وه‌یه‌ك له‌سه‌ر ئه‌م باسه‌:

١- كاتێك په‌یامبه‌ری خودا ﷺ ده‌فه‌رموێت: ( شاة أعرابية ) واته‌ ئه‌و مه‌ڕه‌ی له‌ ده‌شت به‌خێو ده‌كرێت و به‌ له‌وه‌ڕی سروشتی ده‌ژیت و له‌ جۆره‌كانی ڕووه‌كی سروشتی ده‌خوات نه‌ك مه‌ڕێك ئالیك یان گه‌نم یان جۆ یان نه‌نه‌ ڕه‌ق یان پاشماوه‌ی خواردنی ئاده‌میزاد ده‌خوات.

٢- پێویسته‌ مه‌ڕه‌كه‌ مام ناوه‌ند بێت چونكه‌ ئه‌گه‌ر زۆر گه‌وره‌ بێت دوگه‌كه‌شی گه‌وره‌ ده‌بێت ئه‌وكات ناتوانرێت بوخرێت و خواردنی ده‌بێته‌ زیان وه‌ ئه‌گه‌ر زۆر بچوكیش بێت مه‌به‌سته‌كه‌ ناپێكێت.

وه‌ ده‌رباره‌ی چۆنییه‌تی دروست بوونی ئه‌م نه‌خۆشییه‌ ئیمامی ( ابن القيّم ) ده‌ڵێت: ( فَإِنَّ هَذَا المرَضَ يَحْدُثُ

مِنْ يُبْسٍ، وَقَدْ يَحْدُثُ مِنْ مَادَّةٍ غَلِيظَةٍ لَزِجَةٍ، فَعِلاَجُهَا بِالإِسْهَالِ، والأَلْيَةُ فِيْهَا **الخَاصِّيَّتانِ: الإِنْضَاجُ ، والتَّلْيينُ**، فَفِيْهَا الإِنْضَاجُ والإِخْرَاجُ، وَهَذَا المَرَضُ يَحْتَاجُ عِلاَجُهُ إِلَى هَذَيْنِ الأَمْرَيْنِ...)[١]. واتـە: **ئەم نەخۆشییە لە میانی وشكبوونەوەوە دروست دەبێت، وە هەندێك جار بەهۆی بوونی مادەیەكی لینجی توندەوە دروست دەبێت، چارەسەری بەشلبونەوەی ماسولكەكانە، وە دوگی ئاژەڵی عەرەبی دوو تایبەتمەندی تێدایە: بوژانەوەی ماسولكەكان و نەرم بوونی ئەو وشكیەی دروست بووە، بۆیە ئەم دوگە ئیشی بوژانەوە و دەركردنی ئەو مادە لینجە توندەیە، ئەم نەخۆشیەش پێویستی بەم دوو چارەسەرەیە.**

***

(١) زاد المعاد (٤/٦٦).

### ١٥- ئاوی سارد:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: **( الحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَأَبْرِدُوْهَا بِالماءِ )**[١].

واتە: **تا و گەرم بوونی لەش لە گەرمی دۆزەخەوەیە، ساردی بکەنەوە بە ئاو.**

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ( عَنْ أَسْمَاءَ: أَنَّهَا كَانَتْ تُؤْتَى بِالمرْأَةِ الموْعُوكَةِ، فَتَدْعُو بِالماءِ، فَتَصُبُّه فِيْ جَيْبِهَا، وَتَقُوْلُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: **ابْرُدُوْهَا بِالماءِ، وَقَالَ: إِنَّهَا مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ )**[٢].

---

(١) رواه البخاري برقم (٣٢٦٤) ، ومسلم برقم (٢٢٠٩) .

(١) رواه البخاري برقم (٥٧٢٤) ، ومسلم برقم (٢٢١١) واللفظ له

.

واتـە: **لە ئەسمائەوە: ئافرەت دەهێندرا بۆ لای کە تای هەبووایە، داوای ئاوی دەکرد و دەیکرد بە سنگیدا ( یەخەی کراسەکەی )، وە دەیوت: پەیامبەری خودا ﷺ دەیفەرموو: ساردی بکەنەوە بە ئاو، وە دەیفەرموو: بەڕاستی ئەم گەرمییە لە گەرمی دۆزەخەوەیە.**

لە فەرموودەیەکی تردا پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت:

( إِذَا حُمَّ أَحَدُكُمْ فَلْيُسَنَّ عَلَيْهِ المَاءُ البَارِدُ ثَلاَثَ لَيَالٍ مِنَ السَّحَرِ )[١].

واتـە: **ئەگەر هەرکەس لە ئێوە تای هەبوو با ئاوی ساردی بەسەردا بکرێت سێ شەو لە پارشێودا.**

هەربۆیە ئێستا زانستی پزیشکی سەردەم ( الطِّبّ الحديث ) ئەوەی ئاشکرا کردووە کە ئاوی سارد چارەسەرە

---

(٢) حسّنه الألباني في ( صحيح الجامع الصغير ) برقم (٤٩٧).

بۆ نەخۆشی پێست تەنانەت هەندێك دەڵێن چارەسەرە بۆ سەرەتان و شێرپەنجەی مەمك، وە ئەگەر دیقەتی قورئان بدەین دەبینین خوای گەورە شیفای پەیامبەر ئەیوب بە ئاوی سارد دەدات، خوای گەورە دەفەرمووێت بە پەیامبەر ئەیوب: ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴾[1].

واتە: **بە قاچەكانت لە زەوی بدە ئاوێكی ساردت بۆ هەڵدەقوڵێت خۆتی پێ بشۆ و لێی بخۆرەوە.**

---

(١) سورة ص، الآية (٤٢).

## ١٦. داخکردن:

پەیامبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ( الشِّفَاءُ فِيْ ثَلَاثَةٍ ...كَيَّةُ نَارٍ وَأَنْهَى أُمَّتِيْ عَنِ الكيِّ )[١].

واتە: **شیفا لە سێ شت دایە ... - یەکێك لەوانە - داخکردن بە ئاگر وە ڕێگری داخکردن بە ئاگر دەکەم لە ئومەتەکەم.**

پەیامبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ( إِنْ كَانَ فِيْ شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ أَوْ يَكُونُ فِيْ شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُم خَيْرٌ فَفِيْ ... لَذْعَةٍ بِنَارٍ تُوَافِقُ الدَّاءَ وَمَا أُحِبُّ أَن أَكْتَوِيَ )[٢].

---

(١) رواه البخاري برقم (٥٢٦٩).

(٢) رواه البخاري برقم (٥٦٨٣)، ومسلم برقم (٢٢٠٥).

واتـە: **ئەگەر لە شتێك لە چارەسەرەكانتاندا چارەسەر هەبێت ئەوا ... لە داخكردندايە بەر نەخۆشييەكە بكەوێت وە من حەزم لە داخكردن نيە بيكەم.**

## ڕونكردنەوەيەكى پێويست:

زانايان لە ڕاڤەى ئەو فەرمووادنەى لەم باسەدا هاتووە دەڵێن هەموو ئەو فەمووادنەى ڕێگرى دەكەن لە داخكردن بە ئاگر بۆ ( كەراهەتە ) بەو مانايەى ئەگەر توانرا بە جگە لە داخكردن چارەسەر بەكار بێت باشتر و چاكترە، خۆ ئەگەر داخكردن بەكارهات لە كاتى پێويستى ( الحاجة ) ئەوا دروستە و هاوەڵاٚن بەكاريان هێناوە وە چارەسەر و شيفاى تێدايە بإذن الله.

***

## ١٧. تێكەڵ كردنی لیكی مرۆڤ و خۆڵ لەگەڵ ڕوقیەدا:

لە دایكە عائیشەوە دەفەرموێت: ( أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُوْلُ لِلْمَرِيْضِ: بِسْمِ اللهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيْقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيْمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا )[1].

واتە: **بەڕاستی پەیامبەری خودا ﷺ لە ڕوقیەی نەخۆشدا دەیفەرموو: بەناوی خودای گەورە خۆڵی زەویەكەمان، بە لیكی هەندێكمان، دەبێتە شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشمان بە ئیزنی پەروەردگارمان.**

وە مانای فەرموودەكە وەكو زانایان **دەفەرموون بەم شێوازەیە:** ( وَمَعْنَى الحَدِيْثِ أَنَّهُ يَأْخُذُ مِنْ رِيْقِ نَفْسِهِ عَلَى أُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ ثُمَّ يَضَعُهَا عَلَى التُّرَابِ

(١) رواه البخاري برقم (٥٧٤٥) ، ومسلم برقم (٢١٩٤) .

**فَيَعْلَقُ بِهَا مِنهُ شَيْءٌ فَيَمْسَحُ بِهِ عَلَى الموْضِعِ الجَرِيْحِ أَوِ العَلِيْلِ، وَيَقُوْلُ هَذَا الكَلَامِ فِيْ حَالِ المسْحِ )**[(١)].

**واتـە:** مانای فەرموودەکە ئەوەیە پەنجەی شایەتومانی بە لیکی خۆی تەڕ دەکات، پاشان پەنجە تەڕەکەی دەخاتە سەر خۆڵ بۆ ئەوەی هەندێك خۆڵی پێوە بێت، پاشان دەیهێنێت بە شوێنی برین یان نەخۆشییەکەدا، وە ئەو قسەیە دەڵێت لە کاتی پێ هێنانەکەدا.

**پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم کارە تایبەتە بە پەیامبەری خودان یان گشتییە و بۆ هەموو کەسێکە؟ وە ئایا تایبەتە بە خۆڵی مەدینەوە یان هەموو خۆڵێك دەگرێتەوە؟**

---

(١) شرح النووي على صحيح مسلم (١٨٤/١٤) ، فتح الباري (٢٠٨/١٠) ، زاد المعاد لابن القيم (١٨٦/٤-١٨٧) .

بۆ وەڵامی ئەم دوو پرسیارە دەڕۆینە خزمەت فەتوا و وتەی زانایانمان لەسەر ئەم باسە:

١/ پرسیار لە ( اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء ) كراوە كە پێك هاتبوون لە:

عبد العزيز بن عبدالله بن باز - سەرۆكی لیژنە.

عبد العزيز آل الشيخ - جێگری سەرۆكی لیژنە.

صالح الفوزان - ئەندام.

بكر أبو زيد – ئەندام.

دەقی پرسیارەكە:

وَرَدَ فِيْ صَحِيْحِ البُخَارِي عَنْ عَائشَة أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُوْلُ لِلْمَرِيْضِ: **بِسْمِ اللهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيْقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيْمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا.**

وَهَل قَوْلُـهُ ( بِرِيْقَةِ بَعْضِنَا ) تَدُلُّ عَلَى تَخْصِيْصِ البَعْضِ دُوْنَ البَعْضِ الآخَرِ ؟ كَمَا آمَلُ مِنْ سَمَاحَتِكُمْ شَرْحُ الطَّرِيْقَةِ الصَّحِيْحَةِ لِتَطْبِيْقِ هَذا الحَدِيْثِ عَمَلِيَّاً.

واتـە: لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە دایكە عائیشەوە (دواتر فەرموودەكە دەهێنێت )، ئایا وتەی ( تفی هەندێكمان ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تایبەتە بە هەندێكەوە جگە لە هەندێكی تر؟ ئومێدەوارین لە بەرێزتان ڕێگای دروستی ئەم فەرمودەیەمان بۆ ڕاڤە بكەن بۆ جێبەجێكردنی لە ڕووی كردارییەوە.

الجواب:

هَذَا الحَدِيثُ عَلَى ظَاهِرِهِ، وَهُوَ أَنْ يَعْمِدَ الرَّاقِي إِلَى بُلِّ أُصْبُعِهِ بِرِيْقِ نَفْسِهِ ثُمَّ يَمَسُّ بِهَا التُّرَابَ، ثُمَّ يَمْسَحُ بِأُصْبُعِهِ عَلَى مَحَلِّ الوَجَعِ قَائِلاً هَذَا الدُّعَاءَ، وَأَكْثَرُ العُلَمَاءِ عَلَى أَنَّ هَذِهِ الصِّفَةَ عَامَّةٌ لِكُلِّ رَاقٍ وَلِكُلِّ أَرْضٍ، وَذَهَبَ بَعْضُهُمْ إِلَى أَنَّ ذَلِكَ مَخْصُوْصٌ بِرَسُوْلِ اللهِ وَبِأَرْضِ المدِيْنَةِ، والصَّحِيحُ هُوَ الأَوَّلُ لِعَدَمِ المخَصِّصِ[1].

واتـه: ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ له‌سه‌ر ڕوكه‌شه‌كه‌یه‌تی، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ ئه‌و كه‌سه‌ی ڕوقیه‌ ده‌كات په‌نجه‌ی به‌ لیكی خۆی ته‌ڕ ده‌كات و پاشان ده‌یهێنێت به‌ خۆڵدا، پاشان په‌نجه‌ی

(١) اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء (٧٨-٧٧/١) المجموعة الثانية .

دەهێنێت بەسەر شوێنی ئازارەكەدا و ئەم دوعایە دەخوێنێت، زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن ئەم شێوازە گشتگیرە بۆ هەموو كەسێك كە ڕوقیە دەكات و هەموو زەوییەك، وە هەندێكیشیان بۆ ئەوە ڕۆشتوون ئەمە تایبەتە بە پەیامبەری خوداوە ﷺ وە بە زەوی مەدینە، وە ڕاستیش وتەی یەكەمە لەبەر نەبوونی بەڵگەیەك تایبەتی بكات.

## ڕونكردنەوەیەكی گرنگ لێرەدا:

دەبێت ئەوە بزانرێت كە ئەمە تەبەڕوككردن نییە بە لیكەوە بەڵكو تەنها تێكەڵ كردنی لیكی ئادەمیزادە لەگەڵ خۆڵدا كە جۆرە شیفایەكی تێدایە بە ویستی خودا چونكە - وەك زانرا — ئەمە تایبەت نییە بە پەیامبەری خوداوە ﷺ بەڵكو هەموو كەسێك بۆی هەیە ئەو كارە ئەنجام بدات ئەمەش زۆر ڕوون و ئاشكرایە، وە ئەگەر بوترێت ئەمە

تەبەڕوك بووە بە لیکی پەیامبەری خودا ﷺ ئەوکات ئەبێت بوترێت ئەم کارە تایبەتە بەوەوە وە هیچ کەسێکی تر بۆی نییە ئەنجامی بدات چونکە تەنها لیکی پەیامبەری خودا ﷺ بۆ تەبەڕوکە نەك لیکی تر.

پوختەی باسەکە: زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن ئەم شێوازە تایبەت نییە بە پەیامبەری خودا ﷺ و خۆڵی شاری مەدینە بەڵکو گشتگیرە بۆ هەموو کەس و هەموو زەویەك، وە کۆمەڵێکی کەمینە لە زانایان لەسەر ئەوەن ئەمە تایبەتە بە پەیامبەری خودا ﷺ و خۆڵی شاری مەدینە والعلم عند الله.

## لە کۆتاییدا دەڵێم:

هەموو ئەوانەی باسکرا (١٧) خاڵ بوون لەسەر ئەو شتە سروشتتیانەی کە پەروەردگار وەکو شیفا و چارەسەری داناوە لە قورئان و سوننەت بۆ ئێمەی موسڵمان کە بەکاری بهێنین لەگەڵ پشت بەستنی تەواومان بە خوای گەورە دەبێتە شیفا بإذن الله، - بەندەش - هەستا بە کۆکردنەوەی و ئامادەکردنی بەم شێوازە ...

دواکارم لە پەروەرێنی مەزن ئەم نوسراوە بچوکەمان لێ وەربگرێت و تەرازووی چاکەی دایك و باوکمانی لێ بێبەش نەکات، اللهم آمين.

**وصلّى الله وسلّم على نبيّنا محمد وعلى آل محمد**